# ناسنامەی کتێب



ناوی کتێب: قیامەت و کارەساتەکانی

دانەری کتێب: باوکی عبدالله

ساڵی دانانی: ٢٠٢٣ز – ١٤٤٤هـ

تلیگرامی باوکی عبدالله https://t.me/bawky_abdullah

یوتیوبی باوکی عبدالله https://youtube.com/channel/UCemafNLl88NOlWOvnBew2XQ

# ناوەڕۆکی کتێب:

- ترسی سەلەف لە سەختی دۆزەخ.
- ناوە کوشندەکانی دۆزەخ.
- فریشتەکان و ڕاگری دۆزەخ.



## بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدالله الصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه وبعد.... ربنا اصرف عنا عذاب جهنم إن عذابها كان غراما, ربنا اصرف عنا عذاب جهنم إن عذابها كان غراما, ربنا اصرف عنا عذاب جهنم إن عذابها كان غراما, اللهم اجرنا من النار, اللهم اجرنا من النار, اللهم اجرنا من النار.

خوشك و برایانی بەڕێزم لەم کتێبەدا بە پشتیوانی خوای گەورە (سُبۡحَانَهُۥوَتَعَالَىٰ) دوای پەنا بە خوا لە ئاگری جەهەنەم، وە لەو شتەشی کە لە جەهەننەم نزیکمان دەکاتەوە باسێك زۆر بە کورتی لە جەهەننەم و لە ناوی جەهەننەم و لە عەزابەکانی وە لە ئەهلی جەهەننەم و دانیشتنیان و خواردنیان و خواردنەوەیان باسی خەوفی پێغەمبەری خواتان بۆ دەکەم (عَلَيۡهِ ٱلصَّلَاةُوَٱلسَّلَامُ)، پاشان باسی ترسی صەحابە و پیاو چاکان لە جەهەنم، ئینجا قیاسی بکەین بە ئیمانی خۆمان بەو ترسەی کە لە دڵی ئێمەیە بەرامبەر بە زاتی خوا لەو ترسە کەمەی کە لە دڵی ئێمەیە بەرامبەر بە جەهەننەم و بەرامبەر بەو ئاگرە دۆزەخەی کەوا جەرگی نموونەی وەك سوفیانی ثەوری پارچە پارچە دەکرد.

ئاگرێك ئەگەر لە دوونیا یەك تۆز گەورە بێ هەمووممان بیدەنگ ئەبین، هەمووی لێی دوور دەکەوێتەوە هەموو خەڵك ئەکەوێتە تەلەفۆن کردن کە بە زووترین کات ئاگر کوژێنەرەوە بێت، بەڵام وای بۆ قیامەت وای بۆ ئاگرێك کە الله (سُبۡحَانَهُۥوَتَعَالَىٰ) دایگیرساندووە، ئەبێت دڵی پێغەمبەری خوا (عَلَيۡهِ ٱلصَّلَاةُوَٱلسَّلَامُ) کە بە چاوی خۆی بینیوویەتی ترسی بەرامبەر ئەو ئاگرە

سـەختە چۆن بێ؟ خوای گەورە لە ئایەتی (٧١ و ٧٢ )ی سـورەتی مەریەم ئەفەرمووێت: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ ﴾ خوای گەورە ئەفەرمووێت: ئەی ئومەتی محمد هەر لە ئادەم بگرە هەتا کۆتا کەس ئیلا ئەبێ بەسـەر صیراط دا بڕۆن، ئیلا ئەبێ بەسـەر ئەو پردەدا بڕۆن کە ژێری جەهەننەمە، کە ئاگری دۆزەخە کە عەزاب و تووڕە بوونی خوایە، خوای گەورە ئەفەرمووێت: ئیلا ئەو کەسـە دەربازی ئەبێ کە لە الله (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) بترسێ کە لە ئاگری دۆزەخ بترسێ بەڵام زاڵمەکان دۆڕاون و دەکەونە سەر ئەژنۆ.

وە ئەنەس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) بۆمـان دەگێڕێتەوە ئەفـەرمووێت: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (والـذي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بيَـدِهِ، لو رَأَيْتُمْ ما رَأَيْتُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلًا ولَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا قالوا: وما رَأَيْتَ يا رَسـولَ اللهِ، قالَ: رَأَيْتُ الجَنَّةَ والنَّارَ).

واتە: سـویند بەوەی گیانی محمدی بەدەستە (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) ئەوەی کە من بینیم لە ئیسـرا و میعراجـدا، ئەوەی کە من ئەزانم و بینیومە ئیوە بیزانن و بیبینن زۆر بە کەمی پێـدەکەنن وە زۆریش ئەگرین، ئەی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) چیت بینی؟ فەرمووی: (رَأَيتُ الجَنَّة) ئەو بەهەشـتەم بینی الله (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) دروسـتی کرد بە دەسـتی خۆی بەو هەموو نیعمەتەی کە تیایەتی، دوای ئومەتەکەم جەهەننەمم بینی ئـاگری دۆزەخم بینی کە سـەد هەزار سـاڵ تا خوای گەورە (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) دایگیرسـاند سـەد هەزار سـاڵ تا سـووری کردەوە سـەد هەزار سـاڵ تاوەکو ڕەش هەڵگەڕا ئەو ئاگرە، ئینجا

غەزەبی خوایە ئینجا عیقابی خوایە، بۆیە پێغەمبەری خوا (عَلَيۡهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) شەو و ڕۆژ دەگریا لە ترسی، لە شەو نوێژ و لە کاری چاکە یەك چرکەی ژیانی (عَلَيۡهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) بەبێ زیکری خوا بەڕێ نەکـــردووە، چـــونکە بـــیـــنی ئەو جەهەننەمە مانای چییە؟ وە بینی خەڵك چۆن عەزاب ئەدرێ.

ئیمامی حەســەنی بەســڕی ئەگێڕێتەوە بۆمان ئەفەرمووێت: **{كان عمر** (رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُ) **ربما تقد له النار}** لەوانەیە ئاگریان داگیرســـاندبێ بۆ عمر **{ وما أدراك ما عمر}** کێ ئەزانێ عمر کێیە؟ ئەو پیاوە بەرێزەییە ئەگەر پێغەمبەرایەتی کۆتای پێ نەهاتبایە ئێستا دەمان گووت: عمر (صلى الله عليه وسلم) ئەوەندە گەورە بووە لای الله ئەوەنـدە لە خوا ترس بووە، عمر لـە هەردوو ڕوومەتی خەتێکی ڕەش بە پێستێوە نووسابوو لەبەر ئەوەی ئەوەندە لە زاتی خوا ئەترسا ئەوەندە لە جەهەننەم ئەترســا، **{ثم يدلي يده}** عمر (رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُ) دەســتی خۆی لە ئـاگر نزیـك دەکردەوە **{ثم يقول يـابن الخطـاب}** ئەی فەرموو: ئەی کوڕی خەتاب **{هل لك على هذا صـبر}** ئەی عمر تۆ ئارام دەگری لەســەر ئاگر، گەر عمر (رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُ) جەهەننەم بەو شێوەیە بە بیر خۆی بهێنێتەوە دەبێ ئێمە چەند پێویستمان پێ بێت.

عبـدالله کوری مســـعود (رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُ) حـافظی قورئـان ئـاگای لەوەیە کە قورئان چۆن دابەزی و لە کوێ دابەزیەوە، ئەو ئیمامە گەورەیە ئبنو مســـعود کە قاچەکانی لە چیای ئوحود قورســـترە لە ڕۆژی القیامەت کە ئەفەرمووێت: **{لو وقفت بين الجنة والنار، فقيل لي: اختر نخيرك يابن مســـعود}** ئێســـتا تۆ هەڵبژاردە بخەرە بەر دەستی خۆت بەرەو بەهەشتت بەرن یان بەرەو جەهەننەم

کامەت پێ خۆشــە؟ یاخود پێت خۆشــە ببی بە خۆڵ فەرمووێ: **{لأحببت أن أكون رماداً}** پێم خۆشــە ببم بە خۆڵ لە کاتێکدا کە هەموو ژیانی قورئان و تەقوا و عیبادەت و لە خوا ترسان بووە.

ئیمامی ثعالبی ئەگێڕێتەوە بۆمان کاتێک ســەلمانی فارسی رەزا و رەحمەتی خــوای لێ بــیــت ئەم ئــایەتەی خــویــنــدەوە ﴿ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ (الحجر:٤٣) کاتێک بە دڵێکی پاك خوێندیەوە بە دڵێکی پڕ ترس بە دڵێکی پڕ لە عیلم، دڵێك ئەیزانی خوا بۆ ئەفەرمووێ، کێ فەرموویەتی، باسی کێمان بۆ ئەکات؟ کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ **{فر ثلاثة أيام}** ســەلمان سێ ڕۆژ ڕایکرد لە ترسی ئەم ئایەتە، لەبەر ئەوەیە رســول الله (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەفەرمووێت: (ســلمان منا أهل بيت) ســـەلمان لە منە چونکە تەقوای لە ئێمەوە نزیکە چونکە ترسی لە جەهەننەم لە ئێمەوە نزیکە، ئەفەرمووێت: ســێ ڕۆژ ســـەلمان ڕادەکات،**{فر ثلاثة أيام هاربا من الخوف لا يعقل}** ســەلمان لە ترسی جەهەننەم عەقلی نەیدەخوێندەوە ســەلمان سێ ڕۆژ ڕایکرد **{فجيء به إلى النبي (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)}** هێنایان بۆ لای پێغەمبەری خوا (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: **{فقال له يا رســول الله أنزلت هذه الآية}** ئەی پێغەمبەری خوا حەقی خۆمە ســێ ڕۆژ ڕابکەم ئەزانی خوا چی دابەزانــدووە، خوای گەورە دایبەزانــدووە ﴿ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ ئەی رســول الله خوای گەورە ئەفەرمووێت: جەهەننەم شـــوێنی هەموو گوناح بار و کافرێکە هەمووان تیا کۆدەکەمەوە، یا رسول الله **{فول الذي بعثك بالحق نبيا}** سوێند

بەو خوایەی کە تۆی بە حەق ناردووە ئەی پێغەمبەری خوا (عَلَيۡهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) **{لقد قطعت قلبي}** ســـوێند بە الله ئەم ئایەتە دڵمی پارچە پارچە کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوۡعِدُهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴾.

ئەی رسـول الله ئێمە چۆن ئارامبگرین لەسـەر ئاگر؟ چۆن خۆمان لەو ئـاگرە بپـاریزین ئەی پێغەمبەری خـوا؟ ئینجـا خـوای گەورە کە زانی ئەمە ڕاســتگۆیە کە زانی دڵی پارچە پارچە بووە لە ترســی جەهەننەم کە الله زانی جەهەننەم بە جـادەی خســتووە عەقلی نـاخوێنێتەوە ئـاخر بەنـدە چۆن تەحەمولی ئـاگری دوونیـا ئەکات تـا تەحەمولی ئـاگری جەهەننەم بکات. ئەم ئایەتانە بۆ دڵی بۆگەنی ئێمە ناگرێنێت ئەو ئایەتانە بۆ عەقلی ئێمە ناوەســتێنێ ئەو ئایەتانە بۆ شــەهەوات لە دڵی ئێمە ناســوتێنێ ئەی خوا لەگەڵ کێ قســە دەکات؟ ئەم ئایەتانە بۆ بەس بۆ ســەلمانە. ئینجا خوای گەورە فەرمووی ﴿ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي ظِلَٰلٖ وَعُيُونٖ ﴾ (المرسلات: ٤١).

ئەی ســـەلمان تۆ بە تەقوایت ئەی ســـەلمان تۆ لە الله ئەترســـی، تۆ مادام لە جەهەننەم ترسای تەقوا لە دڵت دروست ئەبێ.

ئەگێڕنەوە یەزیدی کوڕی مرثد زۆر ئەگریا زۆر بە بەتوندی ئەگریا چونکە ئەمانە ئەیان زانی جەهەننەم یانی چی؟ چونکە ئەیان زانی خوای گەورە بەڵێنی داوە ﴿ لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ ﴾ خوای گەورە جەهەننەم پڕ ئەکاتەوە بە من و بە تۆ بە زید و عمری، ئەفەرموویت: ئەگەر خوا بەڵێنم پێ بدا ئەی یزید لە حەممام

سـجنت دەکەم هەتا هەتایە حەقە بۆ یزید بگری ســارد نەبێتەوە لە گریان لەبەر ئەوەی خوا لە حەممام ئەیهێڵتەوە، ئەی چۆن نەگری یزید؟ ئەگەر خوا بەڵێنت پێ بدات ئەی ئینســانی ســەرکەش ئەی ئەو کەســەی دڵت ڕەق بوو جەهەننەم نەیگریاندی هەتا هەتایە لە جەهەننەمدا زینندانت دەکەم، دیواری هەر ئاگر کەلەپچەکەی هەر ئاگر بێت، خواردنی هەر ئاگر بێت، خواردنەوەی هەر ئاگر بێت، جل و بەرگی هەر ئاگر بێت، قســەی خۆشــی تیا نەبێت، ئەی چۆن نەگریم؟ ئەی چۆن قوڕ بەســەری خۆم نەکەم؟ لە کاتێکدا کە خوای گەورە بەڵێنی بە من داوە ئەو کاتەی گوناح بکەم لە جەهەننەم زیندانت ئەکەم ئەی یزید.

شــەوێکیان عمری کوڕی عبدالعزیز پینجەم خەلیفەی موســڵمانان ئەو خەلیفەیەی لەســەردەمی ئەودا گورگ و مەڕ بە یەکەوە ئاوی دەخوارد ئەو ئیمامە گەورەیەی کە هەموو شەو دەگریا، ئەو ئیمامەی زۆر کات دەیان ووت: کە لە دوورەوە ئەمان بینی عمری کوڕی عبدالعزیز ئەوەندە دەگریا وەک ئەوەی خۆشــەویســتێکی لەبەر دەســتی مردووە. ئەگری عمر ئەی عمر کوا گوناحت؟ ئەی عمر لەبەر چی دەگریی تۆ خەلیفەی موســڵمـانـانی هەتـا ئێســتـاش تۆ ڕەحمەتی بەرەکەتی، ئەی عمر لەسەردەم و تەقوا و دادپەروەری تۆدا گورگ و مەر بەیەکەوە ئاوی دەخوارد. بۆ ئەگری ئەی عمر؟ خێزانەکەی لێی ئەپرســی ئەی عمر بەس پێم بڵێ بۆ ئەگریی؟ خۆ من خێزانتم نابینم گوناح بکەی هەموو شەو ئەگریی هەموو شەو فرمێسکت دێتە خوارێ، هەموو شەو خەوت نییە؟ عمر فەرمووی: بیرم کەوتەوە ئەو کاتەی خەڵك لەبەر دەستی الله یە ئەو کاتەی

کە عمریش وا لەبەر دەســتی الله یە ﴿ فَرِيقٌ فِي ٱلۡجَنَّةِ ﴾(الشــوری: ٧) خوا کۆمەڵیك بۆ بەهەشـــت دەبا. ﴿ وَفَرِيقٌ فِي ٱلسَّعِيرِ ٧ ﴾ (الشـوری: ٧) وە کۆمەڵێکیش بۆ جەهەننەم دەبا. عمر پاشـــان هاواری کرد و زۆر گریا ئینجا لەهۆش خۆی چوو.

ئەی هاوار بۆ ئێمە قوڕ بەسەر ئێمە (اللهم أجرنا من النار) یارب ئەگەر عمر وا بکـات یـارب ئەگەر عمر لەهۆش خۆی بچێ بەو هەموو تەقوایە بەو هەموو شــەو نوێژە بەو هەموو دادپەروەرییە. یارب ئەی ئێمە پەنامان بدە لە دۆزەخ، یارب بەرگەی ئاگری دوونیا ناگرین چۆن بەرگەی ئاگرێك دەگرین کە غەزەبی تۆیە کە توورە بوونی تۆیە.

مالیکی کوڕی دینار ئەگێڕێتەوە ئەفەرمووێت: ئەگەر بتوانم شەو نەخەوم نەك بتوانم تـا بەیـانی لە دیـار فلیمی خراپ لە دیـار غەیبەت لە عـارەق و ڕابواردن بەڵکو هەموو شـــەوی شـــەونوێژ بووە ئەفەرمووێت: گەر بتوانم هەر نەخەوم ســـوێند بە الله نـاخەوم. لەبەر چی؟ ئەترســـم لەو کاتە عەزابی خوا دابەزێ!!! وە ئەگەر مالیك خەوتبێت ئەوا ئەگەر کۆمەڵێك دۆست و یاریدەدەرم هەبوایە باڵاوم ئەکردنەوە بەسەر جادەکان بەسەر شارەکان، پێم ئەوتن هاوار بکەن بۆ هەموو خەڵکی دوونیا **{یا أیها الناس یا أیها الناس النار یا أیها الناس النار النار}** بە خەڵکی بڵێن چۆن دەخەون؟ ئەو جەهەننەمە چاوەڕێتانە چۆن چاووتان چووە خەو؟ چۆن جورئەت ئەکەن بخەون؟ چۆن جورئەت دەکەی

لە دیارفلیمی ڕووت بیت؟ چۆن جورئەت دەکەی غەیبەت بکەی؟ دزی بکەی؟ درۆ بکەی؟ نەزەر بکەی؟.

محمد کوری ناجیا ئەفەرمووێت: **{صـلیت خلف فضـیل بن العیاض}** نوێژم کرد لە دوای ئیمامی الحرمین لە دوای فضـــیلی کوڕی عیاض لە دوای ئەو ئیمـامەی هەموو ژیـانی گریـان بووە، بەس گریـاوە ئەفەرمووێـت: نوێژم دەکرد لە پشـــتێوە ســـورەتی الحاقەی خوێندەوە، هەتا گەیشـــتە ئەو ئایەتەی الله دەفەرمووێت: ﴿ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴾ الله ئەفەرمووێت: ڕاپیچی بکەن ئەو بەندە گووناح بارە ئەو بەندە بۆگەنە دڵ ڕەقەی کە جەهەننەم نەی ئەترســـاند کە جەهەننەم شـەهەواتی لە دڵدا نەمراند، فضیل زۆر گریا لە ترسی جەهەننەم زۆر گریا لە ترسی ئاگر، کوڕەکەیشی لە ترسی ئەو ئایەتە کەوتە سەر ئەژنۆ زۆر گریا.

ئەی هـاوار یـا رب ئەگەر فضـــیـل و علی کوری فضـــیـل بگرین ئەی پەروەردگـار ئەی ئێـمە ئەبێ چـاومـان کوێر بێـت لەبەر گـریـان لەوکاتەوەی کە خۆمان دەناسین گوناح ئەکەین غەیبەت ئەکەین درۆ ئەکەین شـەهەواتی دوونیا بە هەموو بەشـەکانی لە دڵمانە، یا رب ئەوانە هەموو ژیانیان ترســی تۆ بووە هەموو ژیانیان بەو شـــێوە بردۆتە ســـەر ئینجا دەگرین ئینجا تێئەگەن ﴿ خُذُوهُ ﴾ ئەزانێ ﴿ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴾ مانای چییە؟ بۆیە لەهۆش خۆی دەچی بۆیە دەگری.

خـالیـدی کوڕی خەداش ئەفەرمووێـت: بەس کتێبی بـاس و خواســی قیـامەتیـان خوێنـدۆتەوە بەســەر ئەم تـابعیە بەڕێزە کە خۆی نووســەرەکەی بووە، یەکســەر لەهۆش خۆی چووە. (ســبحانك یا رب ســبحانك ما أعظمك) پەنا بە تۆ لە دڵ ڕەقی و لە دڵ بۆگەنیمان یارب یا رب ترســی خۆت دابەزێنە ســەر دڵەکانمـان پێش ئەوەی تووشــی هیلاکەت و ئـاگری جەهەننەم بین ئەفەرمووێت: کتابەکەیان لەســەر خوێندەوە یەکســەر لەهۆش خۆی چووە، ئاگری جەهەننەم قسـەی بڕی نەیتوانی یەك وشـە قسـە بکات باسی قیامەت قسـەی بڕی نەیتوانی وشـەیەک بڵێ، هەتا چەند ڕۆژێك ئەو جەهەننەم و باس و خواسی قیامەتە دڵی پارچە پارچە کرد و هەتا دڵی لە کاروەستا و وەفاتی کرد.

مـالیـکی کوڕی دینـار ئەفەرمـووێـت: کـچەکەی ربیـعی کـوڕی خـذیم فەرمووی: بابە گیان بۆ ناخەوی خوا نافەرمووێت: ﴿ وَجَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ لِبَاسًا ﴾ شـەو بۆ ئیســـراحەتە بابە گیـان دە بخەوە وەکو بـاوکی خەڵکی نـاڵێم لە دیار فلیمی ڕووت بە نـاڵێم لە عـارەق و لە غەیبەت و لە ژمـاردنی پـارەی دوونیـا بە، بـابە ئەڵێم دوای ئەوەی شەونوێژت کرد بخەوە، بابە گیان هەموو خەڵك خەوتووە تۆ بۆ ناخەوی؟ دڵێك فەرمووی کە پڕە لە ترســی خوا لە ترســی جەهەننەم، وتی: ئاگر لێ ناگەڕێ باوکت بخەوێ کچی خۆشەویستم ئەو کەسەشی کە دڵی وەکو دڵی ئێمە بێ چۆن جورئەت دەکات بخەوێ؟ ئەی لە جەهەننەم بە چی دەربازی ئەبێ کچی من چۆن دەربازمان بێت لێی.

**وەک شاعیر دەڵێت:**

تذكر وقوفك يوم العرض عريانا ❁ مستوحشا قلق الأحشاء حيرانا
والنار تلهب من غيظ ومن خنق ❁ على العصاة ورب العرش غضبانا
اقرأ كتابك يا عبد على مهل ❁ فهل ترى فيه حرفًا غير ما كان
فلما قرات ولم تنكر قر اءته ❁ وأقررت إقرار من عرف الأشياء عرفانا
نادى الجليل خذوه يا ملائكتي ❁ وامضوا بعبد عصى للنار عطشانا
العاصون غدًا فى النار يلتهبوا ❁ والموحدون لدار الخلد سكانا

بیر لەو ڕۆژە بکەوە بیر لەو ڕۆژە سەختەی وا لەناو ئاگری جەهەننەمین ئەسوتیین هەموو چواردەورت ئاگرە، قسەکردنت هەر ئاگرە، هەناسەت هەر ئاگرە، ئاو و خواردنت و جل و بەرگت هەمووی هەر ئاگرە، زۆرت تینووە هاوار ئەکەی یا مالیك، هاوار ئەکەی ئەی مالیك ئەی گەورەیی جەهەننەم زۆرمان تینووە یا مالیك، ئەی مالیك ئەو بەڵێنەی کە خوا دای بمان سوتێنێت وا ئێستا جیبەجێ بووە، یا مالیك ئەو زنجیرە ئاسنیانە پەکی خستوین، یا مالیك یا مالیك. ئەی مالیك ڕۆژی حەفتا و سەد جار ئەو پێستەی سێ ڕۆژ و سێ شەو پان ئەبی هەر هێشتا تەواو نەسووتاوە خوای گەورە زیندووی ئەکاتەوە، ئەی مالیك دەرمان بهێنە گوناح ناکەین زینا ناکەین عارەق ناخۆین غەیبەت ناکەین شەهەوات لە دڵی خۆمان دەردەهێنین، یا مالیك دوای هەزارەها ساڵ ساڵ لە سووتان لە تینویتی لە ئاگر، پاشان وەڵام دێت دەمت دادەخرێت، ئەمڕۆ هیچ قسە مەکە ئەمە دوای چەند هەزار ساڵ تینویتی و هاوار ئەمە وەڵامەکەیە.

ئەی هاوار بۆ ئەو ڕۆژە سەختەی کەوا گوناح لە بیری بردینەوە دوونیا لە بیری بردینەوە ئافرەت لە بیری بردینەوە شەهادە و سەیارەکەم لە بیری بردینەوە بەڵام سەیری ئەو پیاوە گەورانە بکەن سەیری ئەم خوا ویستانە بکەن ژیانیان چۆن بووە؟ با لە الله بترسین لەو ڕۆژە سەختە بترسین لەو جەهەننەمەی کە دڵی اصحابی رسول الله ی (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ) پارچە پارچە کرد، لە کاتێکدا لە ژیان بوون الله لێیان ڕازی بوو.

ئەو ئایەتە گەورەیەی ﴿ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوۡعِدُهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴾ سێ ڕۆژ سەلمانی بەدەر نا عەقڵی نەیدەخوێندەوە، سەلمان چۆن تەحەمولی ئاگر دەکات؟ یا رسول الله دڵم پارچە پارچە بوو بەو ئایەتانە. ئێمە ئەگەر دڵیشمان ئەوها نییە ئەوەندە ڕەش و بۆگەنمان کردووە بە شەهەوات و بە سەیرکردنی حەرامەکان، با ئێستا دوعا بکەین (یا رب یا مقلب القلوب ثبیت قلوبنا علی الخوفك ثبیت قلوبنا علی الخوف النار) ئیلاهی دڵمان نەرم بکە بۆ ترسی خۆت بۆ ترسمان لە جەهەننەم، ترسی ئەو جەهەننەمە داخیلی دڵمان بکە هەرچی شەهەواتە بیسوتێنی بیمرێنی، یارب (اللهم أجرنا یارب) زۆر پەنا بگرن بە ئاگر، زۆر پەنا بگرن بە ئاگرێك کە هێشتا زۆر جاهیلین بەرامبەری ئەگەر ئەو جەهەننەمە لە هەر دلێك بچەقێ ژیانی دوونیای حەرام و تاڵ دەکات یەك چرکە لە یادی خوا بیئاگا نابی یەك دەقە بەبێ فرمێسك نابی، چونکە ئەزانی ئاگر عەزابی خوایە ئاگر زۆر بە ئازارە. بۆیە خوا ئەفەرمووێت: (سُبۡحَانَهُۥ وَتَعَالَىٰ)﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا ﴾(التحریم:٦) ئەی کۆمەڵی ئیمانداران نەفسی خۆت نەفسی

ماڵ و منداڵت لە گوناح بپارێزە هەتاوەکو لە جەهەننەم پارێزراو بیت ﴿ وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ ﴾ ئەی ئیمانداران تۆ سووتەمەنی ئەو ئاگرە جەهەننەمەی بە تۆ و بە لاشەی تۆ خۆشی ئەکەم بۆوا ئەکەی خۆت و ماڵ و منداڵت ببێتە سوتەمەنی جەهەننەم بە بەردی کیبریتی ئەو ئاگرە خۆشەکەم ﴿ عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ ﴾ بەڕێوبەرەکانی مەلائیکەتەکانن نە چاویان هەیە نە گوێ خوای گەورە وای دروست کرودوونە زۆر توند زۆر ڕەق زۆر بەهێزن ﴿ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ ﴾قسەی خوا ناشکێنن هەتا هەتایی خوا ئەمری پێکردوون عەزابی ئاگر بۆ ئەهلی ئاگر جێ بەجێ بکرێت ﴿ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾ ڕاستەوخۆ ئەوە جیبەجێ ئەکەن کە الله پێیان ئەفەرمووێت.

**ناوەکانی ئاگری دۆزەخ:** ناوێکی پێغەمبەری خوای (عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) وا لێکرد هەموو شەو شەونوێژی دەکرد لە رکعاتێکدا حەوت جوزئی دەخوێند، یارب ناوێك بۆ گوناح باری وەک ئێمە زۆرە چ جای ئەو هەمووە ناوە یارەبی بەزەیت پێمان بێتەوە لە دوونیا و لە ئاخیرەت یارب هەروشەیەکی ئاگر بەسە بۆ ئەو کەسەی کە لە تۆ بترسێ و بۆ ئەو کەسەی کە لە جەهەننەمەکەت بترسێ چ جای بۆ ئەو هەموو ناوە سەختە. ئەوە وای کرد کەوا اصحابی رسول الله (صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ) و کە ئەو تابیعیە بەڕێزانە ئەو پیاو چاکانە لەهۆش خۆیان بچن و ڕوحیان دەربچی لە ترسی ئەو جەهەننەمە سەختە یارب ئیمانی ئێمە تەحەمولی یەك ناو ناکات پەروەردگار پەنا بە تۆ دەگرین.

**یەك لە ناوە کوشـــندەکانی دۆزەخ: -النار-** خوای گەورە (سُبۡحَانَهُۥوَتَعَالَىٰ) ئەفەرموویت: ﴿ فَرِحَ ٱلۡمُخَلَّفُونَ بِمَقۡعَدِهِمۡ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓاْ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُواْ لَا تَنفِرُواْ فِي ٱلۡحَرِّۗ قُلۡ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرّٗاۚ لَّوۡ كَانُواْ يَفۡقَهُونَ ﴿٨١﴾ ﴾(التوبة:٨١) مونـافیقەکان پێیان نـاخۆش بوو لەگەڵ محمـد دەربچن بۆ قیتال و جیهاد ناو شـــاریان پێ خۆش بوو، تەنها ناو ژنانیان پێ خۆش بوو، پارە و ژیان و قەصـــر و قەمەرە و شـــەهادەکەیان پێ خۆشـــتر بوو لەوەی لەگەڵ رســـول الله بن (صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) پێیـان ناخۆش بوو دەربچن بۆ دیفاع لە دینی الله، دیفاع لە پاراستنی نەفسی خۆیان لەو ئاگرە جەهەننەمە، نەك بە خۆیـان نەیـان دەکرد بەڵکو بە خەڵکیـان ئەوت مەچن ڕۆژێکی زۆر گەرمە ئەی محمـد پێیـان بڵێ: ئەوەی کە تۆ و ئەصـحـابە ڕاســتگۆیەکانی دەرکردووە ئەهلی ئاگرە و گەرمایی ئەو ئاگرەیە، قل النار بەو مونافیقانە بڵێ: ڕاســتە جەهەننەم گەرمە بەڵام ئەو گەرمایە وای لێکردین ئێمە بە دەشـــت بکەوین ئەو گەرمایە وای لێکردین تەحەمولی گەرمای دوونیا بکەین بۆ ئەوەی لە گەرمـای قیـامەت پارێزراو بین ﴿ قُلۡ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرّٗاۚ ﴾ بەو مونـافیق و نەزانـانە بڵێ: وە بـە نموونەی وەك ئەوانیش بڵێ: کە ئـازان لە گونـاح کردن ئاگری جەهەننەم زۆر بە هێز تر و گەرم ترە ﴿ لَّوۡ كَانُواْ يَفۡقَهُونَ ﴿٨١﴾ ﴾ ئەگەر تێ بگەیشـتنایە ئەگەر قیاسـی گەرمای دوونیایان بە ئاخیرەت بکردبایە نەك هەر دەرنەدەچوون بەڵکو هەموو ڕۆژێـک بە ڕۆژوو ئەبوون هەموو ڕۆژێـک خۆی توشی ئەو گەرمایە دەکرد بۆ ئەوەی لە گەرمای قیامەت پارێزراو بێ.

**ناوێکی تر لە ناوەکانی ئاگری دۆزەخ:** -السـعیر- ئاگرێکی بڵێسەدارە ئاگرێکی داگیرساوە، خوا ئەفەرمووێت: (سُبۡحَانَهُۥ وَتَعَالَىٰ)﴿ بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلسَّاعَةِۖ وَأَعۡتَدۡنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا ﴾(الفرقان: ١١) خەڵکی قیامەت بە درۆ دەخاتەوە نەك لێی ناترسێ بەڵکو خوای گەورە ئەفەرمووێت: ئەم ساعە و قیامەتە و جەهەننەمەیان بە درۆ خستەوە، ﴿ وَأَعۡتَدۡنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا ﴾ خوای گەورە ئەفەرمووێت: ئەو سعیرا ئاگرێکی بڵێسەدارە بۆ درۆزنەکان کە دوو جۆر بەدرۆ خستنەوەی قیامەت هەیە یەك کافرەکان دەیکەن یەك گوناح باری وەکو من و نموونەی وەك من ئەیکات، تۆ گەر قیامەت بەدرۆ ناخیەتەوە من ئەگەر بە درۆم نەخستایەوە نەئەبوو گوناح بکەم چونکە ئەزانم گوناح و قیامەت دوو شتی دژە یەکن ئەگەر بڕوام بە قیامەتە بۆ گوناحم کرد بۆ حیسابم بۆ خوای قیامەت نەکرد بۆ کردەوەم بۆ بەهەشت نەکرد بۆ وازم لەو شتانە نەهێنا کە دووچاری جەهەننەم و ئەو ئاگرە سەختەم بکات.

**ناوێکی تر لە ناوەکانی ئاگری دۆزەخ:** ئەو ناوەی کەوای لە سەلمان کرد سێ ڕۆژ بێتە دەرێ (لا یعقل) عەقلی نایخوێنێتەوە لەبەر ناوە بەهێزەکەی، لەبەر قورسایی ناوی ﴿ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوۡعِدُهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴾(الحجر: ٤٣) خوا ئەفەرمووێت: ﴿ وَلِلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴾(الملك:٦) ئەوانەی کافر بوون بە قیامەت ئەوانەی کافر بوون بە خوای پەروەردگار بە

خالقیان بە مەعبودیان، خوای گەورە ئەفەرمووێت: عەزابی جەهەننەمیان بۆ هەیە ﴿ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴾ بەڕاستی خراپترین شوێنە.

**ناوێکی تر لە ناوەکانی ئاگری دۆزەخ:** کە هەمان مانای سـعیری هەیە خـوای گەورە ئەفەرمـووێـت: ﴿ كَلَّآۖ إِنَّهَا لَظَىٰ ﴾ (المعـارج: ١٥) خـوای گەورە ئەفەرمووێت: بەڕاسـتی ئاگر ئامادەیە دۆزەخ ئامادەیە بلێسـەدارە داخ لە دڵە بۆ گوناح باری وەکو ئێمە و بۆ ئەوانەشی کە کافر بوونە بەو ڕۆژە.

**ناوێکی تر لە ناوەکانی ئاگری دۆزەخ:** -سـەقەر- شـوێنی نویژنەکەرەکانە هەر ناوەکەی سـوێند بە الله ئەگەر دڵمان لەگەڵ خودا بوایە سـوێند بە الله ئەگەر ترسی الله لە دڵمان بوایە ئەو ئایەتانە دڵی ئێمەشی پارچە پارچە دەکرد، سـوێند بە الله ئەو ئایەتانە وای لێ ئەکردین نەك گوناح نەکەین بەڵکو وەکو تابیعیەکان بڵێن قەت ناتوانم بخەوم نەوەکو عەزابی خوا بێ سـەقەر شـوێنێکی قوڵ و دژوارە خوا ئەفەرمووێت: ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبۡقِي وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٞ لِّلۡبَشَرِ ﴿٢٩﴾ عَلَيۡهَا تِسۡعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ ﴾(المدثر: ٢٧ – ٣٠) ئەوانە بەسـەریان ناچێ ئەوانەی کە نوێژ نەکەر بوون بە تایبەت ﴿ مَا سَلَكَكُمۡ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُواْ لَمۡ نَكُ مِنَ ٱلۡمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمۡ نَكُ نُطۡعِمُ ٱلۡمِسۡكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلۡخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلۡيَقِينُ ﴿٤٧﴾ ﴾ (المدثر: ٤٢ – ٤٧) چی ئیوەی دووچاری سـەقەر کرد دەڵێن: نوێژمان نەدەکرد یارب سجدەمان بۆ گەورەیەتی تۆ نەدەبرد بیرمان چوو لەبەر نەبوونی یەك سجدە شەیتانت دووچاری ئەو سەقەرە کرد، خوای گەورە ئەفەرمووێت:

ئیوە چوزانن دۆزەخ و ســـەقەر چییە؟ هیچ ئەنـدامێکـت نـاهێڵێتەوە ئیلا هەمووی تێك دەشکێنێ.

**ناوێکی تر لە ناوەکانی ئاگری دۆزەخ: -الهاویة-** خوا گەورە ئەفەرمووێت:

﴿ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ۝٩ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا هِيَهۡ ۝١٠ نَارٌ حَامِيَةُۢ ۝١١ ﴾( القـارعـة: ٩ – ١١)نـاوێکی ترە شوێنێکی قوڵ و بەرەو خوارە، صەحابەکان دەڵێن: لەگەڵ پێغەمبەری خوا دانیشـــتبووین (صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ) دەنگێك هات فەرمووی ئەزانن ئەم دەنگە چی بوو؟ فەرموومان الله و رســـولەکەی دەزانی، فەرمووی: ئەوە بەردێکە حەفتا ســـاڵە خوای گەورە دایبەزانـدۆتە ئـاگری جەهەننەم تـازە دەگاتە بنەوە هەر رۆژێکیش بە هەزار ســـاڵە لای خوا (سُبۡحَانَهُۥ وَتَعَالَىٰ) کـاتێـک ئەم ئـایەت و حەدیسـانە ئەخوێنینەوە ئینجا ئەزانین چەند جاهیل و دڵ رەق و بێ ئاگاین لە قیامەت ئەزانین کە گوناح چەند سـەیتەرەی کردۆتە سـەر دڵمان چۆن دڵمان رەق و رەش بووە ئەو قیامەتە سەختەمان لە بیر کردوە.

**ناوێکی تر لە ناوەکانی ئاگری دۆزەخ: -الحوطمة-** ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحُطَمَةُ ۝٥ نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ ۝٦ ﴾(الهمزة: ٥ – ٦) ئەو ئـاگرەی تێك شـــکێنەرە ئەو ئاگرەی ناو هەناوت دەسوتێنێ.

**ژمارەی خەزەنەی ئاگری دۆزەخ:** دیارە دۆزەخ زۆر گەورەیە دیارە دۆزەخ زۆر ترســـناکە کە خوا پەنامان بدات بۆیە خوای گەورە کۆمەڵێك مەلائیکەتی بۆ داناوە نێوانی دوو برۆیەکەیان حەوت ســـەد ســـاڵ رێگایە نێوانی نەرمایی

گوێی بۆ شانی حەوت سەد ساڵ ڕێگایە یاخود پێنج سەد ساڵ ڕێگایە خوا پەنامان بدات، یارب یەك لەو شتانەی کە ئەهلی جەهەننەم و ئەهلی مەحشەر ئەژنۆیان دەشکێ کاتێک ئەبینن جەهەننەم دێ کاتێک ئەبینن ئەو مەلائیکەتە گەورانە دێ پێیان ڕاناوەستی، نۆزدە مەلائیکەت سەرپەرشتی ئاگری دۆزەخ دەکەن وەکو خوا ئەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبۡقِي وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٞ لِّلۡبَشَرِ ﴿٢٩﴾ عَلَيۡهَا تِسۡعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾﴾ نۆزدە مەلائیکەت لەو مەلائیکەتانەی خوای گەورە دروستی کردوون کە گەورەیی حەجمیان دیار نییە ﴿وَمَا يَعۡلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَۚ﴾ (المدثر: ٣١) کەس نازانێ جوندی خوای گەورە چەنێکە؟ پێغەمبەری خوا (عَلَيۡهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) ئەفەرمووێت: لە ئیسرا و میعراج خوای گەورە ئیزنی نەدام وەسفی هەموو مەلائیکەتەکان بکەم وەسفی ئەو مەلائیکەتانەی کەوا عەرشی خوای گەورەیان هەڵگرتووە هەر ئەو دوو سێ ڕیوایەتەی ئیزن دام خوای گەورە کە نەرمایی گوێ و نێوان برۆیەکانتان بۆ نەقڵ بکەم دیارە مەلائیکەت هەیە کەوا زۆر زۆر لەوانە گەورەتریشە.

لە کۆتاییدا دەڵێم: یارب پەروەردگارە خوای جەبار خوای قەهار داوات لێدەکەین بەناوی جوانت بە صیفاتی بەرزت یا الله داوات لێدەکەین یا الله بۆ خاتری ناوی جوانت لەو ئاگرە بمان پارێزە پەروەردگارا یارب سەبر ناکەین لەسەر ئاگری تۆ یارب ترسی جەهەننەم لە دڵماندا جێگیر بکە یارب مەمان سوتێنە بە ئاگری جەهەننەم پەروەردگارا ڕەحممان پی بکەی لە دوونیا وە لە ئاخیرەت یارب بەزەییت بە دڵی ڕەقمان بێتەوە (اللهم أجرنا من النار اللهم أجرنا

من النار اللهم أجرنا من النار يا العزيز و يا الغفار ربنا اسريف عنا عذاب جهنم إن عذابها كان غراما ربنا سريف عنا عذاب جهنم إن عذابها كان غراما يارب ولا تشوى خلقنا بالنار اللهم ولا تشوى خلقنا بالنار يارب العالمين اللهم ولا تشوى خلقنا بالنار) یارب بەزەییت بە من و هەموو خوشك و برایەك بێتەوە بە تایبەت گوناح بارێکی وەك من، یارب تۆ عیلمت هەیە بە دڵی بۆگەنی ئێمە چۆن تەحەمولی ئەو جەهەننەم ئەکەین بەو هەموو گوناحەوە، یارب تەوبەی نەسوحمان بە نسیب بکەی پێش ئەو ڕۆژە سەختە، یاربی ئومەتی محمد لە ئاگری جەهەننەم بپارێزی، پەروەردگارا بمان پارێزی لە دۆزەخ، دایك و باوك و خوشك و برا و کەس و کار و عەشیرەت و قەومەکەمان و دۆست و ئەحبابەکانمان پەروەرگار خێزان و منداڵەکانمان بپارێزە لەو ئاگرە، یارب ئەگەر بێو دڵی ئێمە نەرم بوایە پاك بوایە پڕ عیلم بوایە ئەبوایە وەکو ئەو ئەصحابانە وەکو ئەو تابعییانە ئەبوایە بەسەر جادەمان بیخی ئەبوایە خەڵکی ڕەوانی دەریَ بکەین (یا ایها الناس النار النار) خەڵکینە ئاگر ئاگر شتێك نییە وا بە ئاسانی لە بیر بکریَ، خەڵکینە ئاگر لە دوونیا بۆ خۆت تاقی ناکەیتەوە پەنجەیەکی خۆت بسوتێنە بزانە چەندە بە ئازارە چ جای ئاگری دۆزەخ، پەروەردگار أجرنا من النار.



وَصَلَّى اللهُ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلِّمَ.

**باوکی عبد الله**

**١٤٤٤/١٠/١٣هـ**